


# کۆمەڵەی پزیشکانی بەریتانی

## ڕێبەری پزیشکی خێزانی



# تەنگەنەفەسی






نیشانەکان



ئەزمونەکان

پشکنین




چارەسەرەکان

هاوکاریە خۆییەکان

جۆری ژیان

بسم الله الرحمن الرحيم

کۆمەڵەی پزیشکی بەریتانی

ڕێبەری پزیشکی بۆ خێزان

# تەنگە نەفەسی


نوسینی:

د. جون ئایرس

وەرگێڕانی:

بەرزان أمین محمد



٢٠١٠




## پێناسی کتێب

ناوی کتێب : کۆمەڵەی پزیشکی بەریتانی ڕێبەری پزیشکی بۆ خێزان " تەنگە نەفەسی"

بابەت : پزیشکی

نووسینی : د.جون تایرس

وەرگێڕانی: بەرزان آمین محمد

پیت چنین و نەخشەسازی : کۆمپیوتەری سارا

شوێنی چاپ: چوارچرا

ساڵی چاپ : (٢٠١٠ )

ژمارەی سپاردن (١٥٧٥)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە



---




**تەنگەنەفەسی:**

ئەو زنجیرەیەی کە راستەوخۆ وەڵامی هەموو پرسیارە پزیشکی و تەندروستی یەکانت پێش کەش دەکات.

ئەم رێبەرە کورتە ڕونە و وێنەدارە ئامۆژگاری پسپۆڕان سەبارەت بە تێگەیشتنی تەنگەنەفەسی و پێکەوەژیان لەگەڵیدا.




## بابەتەکانی ئەم پەڕاوە:
## هۆیەکانی تەنگەنەفەسی و هاندەرەکانی

- ئامۆژگـاری دڵنیاکـەرو ئاسـانی چەسـپاندن دەربـارەی چارەسـازی حاڵەتی تەنگەنەفەسی.
- چارەسەرە تەقلیدی و تەواوکاری یەکان پێکەوە.
- ئامۆژگاری یە عەمەلی یەکان دەربارەی خواردن و شێوازی ژیان.
- حاڵەتەکانی پزیشکی و خشتە و لیست و سەردانەکان.




## تەنگەنەفەسی چی یە؟

زۆرێك لە خەڵكی تەنگەنەفەسن، منداڵان یان پێگەیشتوان وەك نۆرەیەك لە تەنگەنەفسی هاوڕێ لەگەڵ ناڵە ناڵی جیا دەكەنەوە كە هەندێ جار پاش هەستان بە هەوڵێكی زۆر و هەندێ جاریش لە كاتی پشوودا ڕوودەدات، و هەندێ جار سوك و هەندێ جاری دیكەش مەترسیدارە، وە هەندێ لە هۆكارەكانی دیاری كراوە بۆ چەند نۆرەیەك وەك گیانداران و دوكەڵ و غوبار و تەم و مژ.

هەندێ كەس گومانیان وایە كە تەنگەنەفەسی asthma حاڵەتێكە دوچاری منداڵ بەتەنها دێت و هەندێكی دیكەش پێیان وایە كە ئەمە حاڵەتێكی شیاوەو لەبەر ئەوە دوچاری كەسەكان دەبێت لەهەر تەمەنێكدا بن، وە هەندێ كەس بە بێزاری یەكی لەبەرچاوی دادەنێن و ئەمەیش جگە لە چارەسەرێكی پچڕ پچڕ هیچی دیكەی پێویست نی یە، بەڵام هەندێ كەس بە گرفتێكی گەورەی دەزانن و پێیان وایە كە هەمیشە پێویستی بە چارەسەری بەردەوام هەیە. بەڵام ئایا ئەمە جێگەی بڕوایە كە هەموان لەسەر هەقین؟

ئەمانە لە ڕوانگەیەكی دیاری كراوەوە بەم شێوەیەن، لەگەڵ ئەوەی كە كۆمەڵەیەكی گەورە لە هۆكاری تایبەتی هەن كەدانانی پێناسەیەكی سادەی بۆ دەكەنە كارێكی زۆر گران

ووشەی تەنگەنەفەسی وەك دەربڕینێكی تەواو بەكار دهێنرێ بۆ پەردە پۆشە كردنی حاڵەتێك كە جیا دەكرێتەوە بە چەند دیاردەیەك لە تەنگەنەفەسی یەك كە سەرچاوە لە تەنگەلانی یەكی پچڕ پچڕی بۆری یەكانی هەناسەدان یان بۆری یەكانی هەوا لە ناو سیدا دەگرێت. هەروەها هەندێ هۆكار هەیە كە هاوكاری لە

## تەنگە نەفەسی

گەشەکردنی تەنگە نەفەسیدا وەك لەسەرەتای کارەکەوە و زۆر لە هۆکارەکانی دیکە کە دەبێتە مایەی ڕوودانی تۆڕەکان.
وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هۆکارانە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت.



### نیشانەکانی تەنگە نەفەسی

لە نیشانەکانی تەنگەنەفەسی بڵاوی پڕ ناڵ ئەو هاوەڵ لە زۆر حاڵەتەکاندا دەکات لەگەڵ تەنگەلانی لە سنگ وگرانی لە هەناسەدانیدایەوە.

باشترین پێناسە بریتی یە لەوەی کە حاڵەتێکە لە بۆری یەکانی هەواو لە نێو سی‌یە سوتاوەکاندا دەبێت و دواتر حەساسیەتێکی زۆری دەبێت بۆ چەند هۆکارێکی دیاری کراو کە وا لە بۆری یەکانی هەوا دەکات تەسك ببنەوە و ئەمەش وا لە ڕێژەی ئەو هەوایە دەکات کە بە نێویدا تێدەپەڕێت کەم بێتەوە ئەو کەسە بە دەست تەنگە نەفەسی یان ناڵە ناڵەوە گیرۆدە بێت.



وە ئەو حاساسیەتەی کە



## تەنگە نەفەسی

دوچاری بۆری یەکانی هەوا دەبێت بە دەربڕینی پزیشکی ون بونی کاریگەری لولەکەدەناسرێت وە لە نەشتەرگەری یان بیمارستانەکاندا پزیشکەکان دەستەواژەی لولە ڕاپەڕیوەکان بەکار دێنن.

لەبەر ئەوە تەنگە نەفەسی تەنها یەك نەخۆشی نی یە بەڵکو ژمارەیەکی زۆری شێوازە جیاوازەکانە و لەسەر ساویلکەیی ووشەی شێری پەنجەوە بە شێوەی نزیکردنەوە ووشەی تەنگەنەفەسی ئامـاژە بەجۆرێك لەو حاڵەتانە دەکات کە لەبەردەماندان و ئاماژەش بەو بوارە دەکات کە ڕوبەڕوومان دەبنەوە، وە لە ژێر ناونیشانێکی بڕیندا ڕوبەرێکی فراوان لە پلە بڕندەو ڕوبەرێکی فران لە هۆکارە دیاری کراوەکان و ڕوبەرێکی بەرفراوان لە ئاکامەکان دەدۆزینەوە و ئەوەی کە بەشێوەیەکی مەنتیقی لێرەدا بەرهەم دێت ئەوەیە کە هەمو کەسە دوچاربوەکانی تەنگەنەفەسی وە لولەیەك سود لە یەك شت نابینین و بەڵکو بۆ هەندێکیان ئەو شتە ڕەنگە نەشیاو بێت.

تەنگە نەفەسی حاڵەتێکی زۆر تاکڕەوی یە و پێویستە چارەسەری درێژ خایەن بێت لەسەر پێوەری تاکە کەس و ئەمەش بەهۆی جۆراوجۆری و فرە ڕەگەزی هۆکارە پەنهانی یەکانی پشەوەی هەمو حاڵەتێکی تەنگەنەفەسی.




## خاڵە سەرەکی یەکان

* بەسەرنجدان بۆزۆری ئەو هۆکارانەی کە دەبنە مایەی تەنگەنەفەسی و چەند جۆری پەسەند کرانەکانی بۆری هەوا لە لەشدا ئەوا ئاسان نی یە بە شێوەیەکی ئاسان پێناسەی تەنگە نەفەسی بکرێت.

* تەنگە نەفەسی تەنها یەك نەخۆشی نی یە وە لە سەرساویلکەی وشەی شێرپەنجە تەنگەنەفەسی کۆمەڵەیەکی گەورە لە شێوازە جیاوازەکان دادەپۆشێ.

### ماوەی بڵاو بونەوەی تەنگە نەفەسی چەندە ؟



هەڵێن جاینی لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێ: بریتی یە لە ببڵاو بونەوەیەکی بەرفراوان و قەبڵاندنە نوێ یەکانیش ئاماژە بۆ ڕێژەی ٢٠٪ی منالان دەکەن لە تەمەنی قوتابخانە سەرەتایی یەکان و نزیکەی ٦-٧ ٪ی دانیشتوانی بەریتانیا بەدەست تەنگەنەفەسی یەوە دەناڵێنن.

تەنگە نەفەسی حاڵەتێکی زۆر بڵاوە لەلای گەلانی ڕۆژ ئاوا بە جۆرێ کە زیاتر لە ٣ ملیۆن کەس لە ئینگلتەراو وێلز دوچاری بوون وە لەە نێو منالاندا ژمارەی حاڵەتە دوچاربوەکان لە نێوان کوڕاندا و وهێندەی نێو کیژانە بەڵام لە پێگەیشتواندا ئەم نەخۆشی یە لە نێو ئافرەتاندا زۆر زیاترە وەك ئەوەی لە نێو لاواندا هەیە.




## تەنگە نەفەسی لە منالاَندا

ڕەنگە تەنگە نەفەسی لای منالْ لە زۆرببونی بەردەوامدا بێت واش پێشبینی دەکرێت ٢٠٪ی منالاَن لە تەمەنی خوێندندا بە دەست دیاردەکانی تەنگەنەفەسی یەوە دەناڵێنن.

## ئایا تەنگە نەفەسی لەزۆر بونەوە وەرگیراوە

حاڵەتەکانی تەنگەنەفەسی لەم دو دەیەی دوایدا ڕوی لەزۆر بوون کرد ئەویش بە سەرنجدان لەو پێوەرەی کە لێ یەوە دەڕوانیت بۆ دیاری کردنی تەنگە نەفەسی، بۆ نمونە، ژمارەی ئەو نەخۆشانەی کە ڕاوێژ بە پزیشکەکانیان دەکەن بە هۆی تەنگە نەفەسی یەوە بە تایبەتی لەە ڕیزی منالاَندا (٥) هێندەیە لەچاو ساڵانی نیوەی حەفتاکان و سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، هەروەها زۆربونێکی دیکە لە چونە نێو نەخۆشخانەکان و لەسەرەتای شنەوەدەکاندا ڕویدا بە تایبەتی لە ڕیزی منالاَن، ئەمەش ڕەنگە پەنا بردنی کەس و کارەکان بۆ ڕاوێژی پزیشکی پێچەوانە بکاتەوە لە پێناو منداڵەکانیان و زۆری ئەو کارانەی کە بۆ خۆیان دەیکەن، لەگەڵ بوونی چەندین هۆکاری دیکە لانی کەم تۆ ڕۆڵێکی دیکە لێرەدا بەدی دەکرێت، بەلاَم ئەوەی کە جێگای خۆش حاڵی یە ئەوەیە کە ئەم زۆربونە لە سەرەتای نەوەدەکاندا وەستاو لەو کاتەوە مانەوە لە نێو نەخۆشخانەکاندا کەمی کردووە.




## بۆچی حاڵەتەکانی تەنگە نەفەسی پتر بووە؟

لەبەر ئەوەی کە هەندێ لەم زۆربونە دەگەڕێتەوە بۆ ئوەی کە ژمارەیەك لە پزیشکان ئەمڕۆ ووشەی تەنگە نەفەسی بەکار دێنن لە بری ئەوەی کە لە ڕابردودا دەستەواژەی سوتانەوەی بۆری یەکان و ناڵە ناڵیان بەکار دەهێنا، بەڵام ئەمە ناکرێ کە ڕاڤەی بەشێکی ئەم زۆربونە بکات وە ئەم پتر بونە دەگەڕێتەوە بۆ دوچار بوونی بۆ ئەو بۆنە خۆش و تەنینەوەی ڤایرۆسانەی کە لەماڵدا هەن سەرباری بونی چەند لایەنێکی هاوچەرخی ژیان. وەتەنانەت دەگەڕێتەوە بۆ چارەسەرە بەکارهاتوەکانی تەنگە نەفەسی جگە لەوەی کە بەڵگەکان ئاماژە بە بەرپرسیارێتی یەکێك لەم هۆکارانە بەتەنهایی یەکی زۆر دیاری کراو دەکەن، وە لە ڕاستیدا ئەم پتر بونە لە ڕەفتی ئەم هۆکارانەوە سەرچاوە دەگرێ لەگەڵ ئاماژە کردن بۆ ئەو بۆنە خۆشانەی کە هۆکاری گرنگن.

ئەو کۆچانەیکە لە تەنگە نەفەسی یەوە سەرچاوە دەگرن لە باسی بەختدا، ئەو کۆچانەی کە لە تەنگە نەفەسی یەوە سەرچاوە دەگرن کارێکی دیار نین وە لە نیوەی شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا نەخۆشی یەکی ماوە کورت لەو مردنانە سەرچاوەی گرت کە لە تەنگە نەفەسی یەوە هاتە کایەوە هەندێ کەس پێیان وابوو کە ئەمە لە کاریگەری ژەهراوی یەکێك لە کەپوەکانی تەنگە نەفەسی فرۆشراوە لەو کاتەوە سەرچاوەی گرتوە و ئەم ڕاڤەیە بۆتە شوێنی مشت و مڕ بە درێژایی ساڵان و هەندێ هۆکاری دیکەش ڕۆڵی گرنگی خۆی لەو کێشەیەدا هەبووە وە ئەگەری ئەوە ناکرێ کە ڕۆژێ لە ڕۆژان تەواوی ئەو چیرۆکە بزانین کە دەوری ئەم ڕوداوەی داوە.

لە ڕاستیدا زۆربەی ئەو مردوانەیکە تەنگە نەفەسی بۆتە هۆیان سەرچاوە لە نەبونی چارەسەری نەخۆشەکانەوە بە شێوەیەکی تەواو دەگرن وە دەرکەوتوە کە سێ یەکی مردوەکان لە تەنگە نەفەسیدا بە پێ ی توانا بە هۆی چارەسەری گونجاوەوە بووە و ئەمەش کە بەم دوایی یانە تۆمار کرا بەرز بونەوەیەکی کەم بوو لە ژمارەی ئەو مردنانەی کە سەرچاوە لە تەنگەنەفەسی یەوە دەگرن لە لای ئەو نەخۆشانەی کە تەمەنیان لەسەری ٥٠ ساڵی یەوەیە، جگە لەمەش ئەم بەرزبونەوەیە لە نەوەدەکاندا وەستاوە. بۆیە هۆی ئەم بەرز بونەوەیە ڕون نی یە، تەنانەت جیاوازی لە نێوان تەنگە نەفەسی و سوتانەدرێژخایەنەکانی بۆری هەناسەدان لەلای نەخۆشە بەساڵاچووەکان زۆر کات دژوارە و هەر ئەمەشە کە دەبێتە هۆی گۆڕانی لە ڕێگەی دەست نیشان کردنیدا.

## جیاوازی شوێنی جوگرافی



زۆر شوێنی دیار لە ئینگلترا هەن کە چونە بیمارستان و ڕاوێژ کردن بە پزیشك بە هۆی تەنگە نەفەسی یەوە تیایاندا زۆر زۆرەو هەندێ ناوچەی دیکەش هەن کە حاڵەتی دوچار بون بە تەنگە نەفەسی کەم بەخۆیەوە بەوی دەکات،جگە لەوەی کە ئەم جیاوازی یە زۆر بە کەمی دەمێنێتەوە و هیچ شێوازێکی جوگرافی ڕون

بەرجەستە ناکات، بە پێچەوانەی حاڵەتەکانی سوتانەوەی تیژی ئەو بۆری یانەی کە بەرزترین ڕێژەیان لە باکوردا بۆ تۆمار دەکەن و ئەم ڕێژەیەش لەباشوردا کەم دەکاتەوە.

جیاوازی یەکان لە نێودەوڵەتێکدا زۆر کەمن بەڵام زۆریش گەورەن لەدابەش کردنی تەنگە نەفەسیدا لە ناوچە جیاوازەکانی جیهان، تەنگە نەفەسی تا ڕادەیەك لای ئەسکیمۆ و ئەو ڕەش پێستانە وانی یە کە لەناوچە گوند نشینەکاندا دەژین، لە کاتێکدا ڕێژەی ٥٠٪ ی دانیشتوانی دورگەکانی کارۆلینی ڕۆژئاوا دوچارن بە تەنگە نەفەسی ٣\٤ ی منالانیشیان بەهەمان شێوەن لە نێوان ئەم دو ئاستەدا گەلانی ڕۆژئاوایی و گەلانی بەریتانیاو ولاتە ئەوروپی ی یەکانی دیکەی وەك ئوسترالیا و نیوز لەندە بەدی دەکەین کە تاڕادەیەك هەمویان هەمان ڕێژە لە تەنگە نەفەسی بەخۆیانەوە بەدی دەکەن، وە ئەوەی کە مایەی بایەخ پێدانە ئەوەیە کە ئەو ناوچانەی کەمتر حاڵەتی تەنگە نەفەسی یان تێدا دەبینرێ ئەو جێگایانەن کە لە بار نین بۆ خورکی تەپ و تۆزی نێو ماڵی ئەوگەلانەی کە تەنگە نەفەسی ناناسن ڕەنگ بێ کە تەنگە نەفەسی لە زۆربەی ولاتان لە زۆربوندا بێت ئەوە نەبێ کە لە هەندێ شوێنی دونیادا بە دەگمەن ماوەتەوە بۆ نمونە، تەنگە نەفەسی لە نێو گەلی ئەسکیمۆی ئەمریکای باکوردا زۆر دەگمەنە، ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە ژینگە سەخت و دژوارەکەیان لە بار نەبێت بۆ خورکی تەپ و تۆزی ماڵ.




## خاڵە سەرەکی یەکان

* بە تەنها لە ئینگلتەراو وێڵز زیاتر لە سێ ملیۆن کەس بەدەست تەنگە نەفەسی یەوە دەناڵێنن.
* کوڕان زۆرتر لە کیژان دوچاری تەنگە نەفەسی دەبن بەڵام حاڵەتی زۆر بڵاو بە نیسبەیەکی کەم، لە ئافرەتاندا زۆر ترە لەوەی کە لە پیاواندا هەیە.

## هۆیەکانی تەنگە نەفەسی و پاڵنەرەکانی

زۆربەی خەڵکی ئەوەدەزانن کە تەنگە نەفەسی ڕەنگە دوچاری چەند تاکێك بێت لە خێزانێکدا، دەبێ گومان پێکهاتەیەکی بۆماوەیی بۆ ئەم حاڵەتە هەیە بە تایبەتی لە تەنگە نەفەسی بۆ نەخۆشی (یان دەرەکی) وە هۆکاری بۆماوەیی زۆر کەمتر کاریگەر دەبێت لای ئەو نەخۆشانەی کە تەنگە نەفەسی لە بۆنی خۆشەوە (تەنگە نەفەسی ناوەکی) سەرچاوە ناگرێت.






## تەنگە نەفەسی چۆن دەست پێ دەكات؟

شیاوی بۆ دوچار بوون بە تەنگە نەفەسی شتێكی ڕەها نی یە، ئەوە شتێكی پۆ ماوەیی نی یە وەك ڕەنگی چاو یان گروپەكانی خوێن، وە دەكرێ كە نەخۆش دوچاری تەنگە نەفەسی یەكی ترسناك بێت و خوای گەورە چەندین منالێكی پێ ببەخشێ كە بەو شێوەیە نەبن... لەبەر ئەوە ڕۆڵی هۆكارە ژینگەیی یەكان (وەك بۆنی خۆش و دوچار بوون بە دوكەڵ كێش خراپ)

لە زۆر ترین بایەخەكانن لە دەركەوتنی تەنگەنەفەسی و تەشەنەكردنیدا ئەوە نەبێ كە ئاشكرایە تۆڕی تەنگە نەفەسی پێویستی بە خاكێكی لەبارە هەتا پێ بگات.

## گرفتی خێزان

تەنگە نەفەسی ئارەزو دەكات (بە تایبەتی كاتێك لە بۆنی خۆشەوە سەرچاوە دەگرێ) بۆ دەركەوتنی لەچەند كەسێكی یەك خێزان دا

## خوركی تەپ و تۆزی

## ماڵەوەو هۆكارەكانی دیكە



لەسەر ئەم پانتایی یەدا دەكرێ كە چەند هۆكارێكی بەرپرس هەبن سەبارەت بەە دەركەوتنی دیاردەكانی تەنگە نەفسی بۆ یەكەمین جار، بۆ نمونە، تەنگە نەفەسی، ی

## تەنگە نەفەسی

پێگەیشتوان لە زۆر حاڵەتدا لەسەر کاریگەری پەتایەك یان تەنینەوەی ڤایرۆسی دەست بەدەرکەوتن دەکات، هەروەهادەکرێ کە دوچار بون بۆ هاندان لە شوێنی کاردا هۆکاری تەواو بێت بۆ دەرکەوتنی تەنگە نەفەسی یەکە.

وە ئەوە نەبێ کە گرنگترین هۆکارەکان:

لە بەپەلە دەرکەوتنی تەنگە نەفەسی دا بە تایبەتی لەمناڵاندا بریتی یە لەدەرکەوتنی خورکی تەپ و تۆزی ماڵەکی ئەم جانەوەرە بچوکە زیندوەیکە قەبارەکەی هێندەی سەری دەمبوسێ نابێ لە نێو ڕاخەرو فەرش و ئەو یاری یانەدا دەژی کە بەجوانی دەورە دراون وە ژمارەیان دەگاتە ٢ ملیۆن خورکە لە هەر فەرشێکدا.

کاتێ کە کەسێکی شایستە بە تەنگە نەفەسی ڕووبەڕوی ئەو پرۆتینە دەبێتەوە کە لە تۆپە چاڵ چاڵی یکانی خورکی تەپ و تۆزی ، لە کێدا بۆ ماوەیەکی دیاری کراو هەن، ئەوا شانەکانی جەستە سپی یەکەی بەو مادە نامۆیە حەساس دەبن و لەگەڵ هەناسە وەرگرتنی پرۆتینەکەدا کارلێك لەناو پۆشی لولە قامیشی یەکاندا ڕوو دەدات و ئەمەش دەبێتە هۆی سوتانەوەی ڕێژەرە هەوایی یەکان پاشان سوتانەوەی ناوپۆشەکەش دەکاتە فاکتەرێك و دواتر هەر دوچار بونێکی دیکە ئەگەر چی بۆ خورکی تەپ وتۆزی ماڵەکی وە یان هەر بۆریی یەکان و دەرکەوتنی دیاردەی تەنگە نەفەسی.

وە هەندێ شتی دیکەش هەن کە دەکرێ هۆکاری یاریدەدەر بن لە دەربەڕینی تەنگە نەفەسی، جگەرە کێشانی دایکان لە کاتی سکپڕیدا و دوچار بونی خراپ بەدوکەڵی جگەرە لە مناڵیدا هاوکاری دەرکەوتنی تەنگە نەفەسی دەکەن لە هەندێ حاڵەتدا.




## خورکی تەپ و تۆزی ماڵەوە



چاك و چۆڵی ئەم خوورکە (گەورەیی یەکەی ٥٠٠ هێندەیە) کە لە نێو فەرش و ڕاخەرەکاندا و لە نێو پارچەکانی دیکەدا دەژی دەکرێ بێتە هۆی دەرکەوتنی تەنگە نەفەسی.

دەرکەوتنی تەنگە نەفەسی

* بۆماوەیی
* جگەرە کێشانی دایك لەکاتی سك پڕیدا
* جگەرە کێشانی خراپ لە منالّیدا
* بۆنەکان (بەتایبەتی خورکی تەپ و تۆزی ماڵەکی)
* پەتاو تەنینەوەی ڤایرۆس
* دووچاربوون بە هۆکاری توش بوون لە شوێنی کاردا




## سوتانەوەی ڕێڕەوە هەوایی یەکان





کەواتە تەنگە نەفەسی لەو سوتانەوە بەرهەم دێت کە وا دەکات ڕێڕەوە هەوایی یەکان زیاتر فاکتەر بن، سوتانەوەش بریتی یە لە هەوڵێگی لەش بۆ وەڵامدانەوە لەگەڵ کۆمەڵێك لە هێرشەکان، ئێمە ئەمە لە زۆرێك لە نەخۆشی یەکان بەدی دەکەین وەك سوتانەوەی جومگەکان و قوڵۆن و پێست و گرفت لای نەخۆشەکان کاتێك دەردەکەوێ کە ئەم سوتانەوەیە ناڕەوێتەوەو درێژخایەن دەبێت هەر وەك ئەوەی کە لە تەنگە نەفەسیدا دەرردەکەوێ.

چینیچکی پارێزەری تەنگ ناو پۆش دەبێت کە پێ دەوترێ کڵمی یان لەبیرکراو، ڕێڕەوی هەوایی سروشتی، ئەم چینە لە چەندین جۆرێکی جیاواز لە شانە پێك دێن کە هەر یەکەیان پابەندن بە کارێکی جیاوازەوە، هەندێکیان کڵم بەرهەم دێنن کە هاوکاری یەکدی دەکەن لە دەرهێنانی کڵم لە ڕێڕەوی هەوایی بە پاڵنەری جیابوە سەرکەوتوەکان بە ناو بۆری یەکاندا بە هۆیجوڵەی پەنجە پێ گەیشتوە بچوکەکان کە بە برژانگ ناسراوە لەسەر ئەم شانانەوەیە. وە ئەم برژانگە هەندێ بنەمای سەرەتاین کە دوکەڵی جگەرە باڵ دەنێ بەسەریاندا، وە ئەو شتە کە وریا دەبێتت لە پتر بوونی کڵمە کەدا چونکە هەمیشە دوکەڵ دەبێتە هۆی سوتان وە

ئەمـەش بریتـی یـە لـە هۆیـەك بـۆ ئـەوەی کـە جگـەرە کێشەکان بەڵغەمیان بە کۆلین لێ بێتـە درێ، هـەروەها لای هەنـدێ لـە دووچار بـوانی تەنگـە نەفەسـی کۆکـەی زۆر ڕوودەدات، وە ئەمـەش شـتێکی کت و پڕ ی نی یە پاش ئەوەی کە بینیمان تەنگەنەفەسی بریتـی لـە حاڵەتێکی سوتانەوە.

لـە ژێـر ئـەو کلّمـەدا چینێکی دیکـە درێـژ دەبێتـەوە( لـە ژێـر ئـەو کلّمە)دا لەسەر چینێکی دەماری لولـەی، دەکـەم دەکـات لـە حاڵـەتی تەنگە نەفەسیدا کاتێ کە نەخۆش هەناسە هەڵدەمژێ وەك ئەو تەپ و تۆزەی کە لە گژوگیاوە دەردەچێت.

وە سێ کاری جیا هـەن کە دەبنـە مایـەی تەنگـە لانـی ڕێڕەوەکـانی هەواو دژواری لـە هەناسـەدانی هـاورێ لەگـەڵ ناڵـە ناڵـدا. یەکـەمیان چـینی ناوەنـدی لـە ڕێـڕەوە هـەوایی یەکـە (لـە ژێـر کلّمەکـەدا) دە ئاوسـێ، وە دەمیـان ڕژێنێکـی کلّمـی بەرێژەیـەکی زۆر گـەورە لـە جیابوەکان (کە پێویستە بۆ کردنـەوەی ڕێڕەوی هـەواڵی بە کۆکین دەریـان بهێنـێ) بەرهـەم دێـت، سـێ یەمیانـدەمارە نـەرم و لوسـەکان کـەم دەبنـەوە بـە هـۆی دەرچـونی چـەند مادەیـەك لـە شـانەی گرگرتوەوە.

وە ئاکامی ئەم سێ کاریگەری یەش بریتـی یـە لـە تەسـك بونـەوەی ڕێـڕەوە هـەوایی یـەکان کـە چـونە ژورەوەو هاتنـە دەرەوەی هـەوا دژوار دەکات و ئەمەش دەبێتە هۆی تەنگـە نەفەسـی هـاوڕێ بەناڵـە نـاڵ و ویـزە ویـز وە چـەندین شـێواز لـە چارەسـەری ئـەم نەخۆشـی یەدا پەرەی سەندوە کە دەکرێ هێرش کردنـی تـەواوی هۆکارەکـان تەسك کردنەوەی ڕێڕەوی هەوایی بێت لـە تەنگـە نەفەسیدا دەکـرێ

دیاردە بێ بونی هۆیەکی ڕوون و لەبەرچاو ڕوبدات یان لە دوچار بونێکی ڕوون بۆ هۆکاری هاندەری ناسراو وەك تەپو تۆزێك کەه هاوین لەه گژوگیا بەرز دەبێتەوە، هەروەها تەنگەلانی ڕێژەوە هەوایی یەکان دەکرێ کە لەگەڵ باش بونی دیاردەکاندا نەمیچنن ئەویش بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وە یان بەهۆی بەکارهێنانی دەرمانێکی شانەوە.

ئەم سیفەتی گۆڕانە بریتی یە لەوەی کە تەنگە نەفەسی زیاتر لە هەر شتێکی دیکە جیا دەکاتەوە وە ئێمە سود لەم سیفەتە وەر دەگرین لەکاتی هەستان بە دیاری کردن ودەست نیشان کردنیداو لە کاتی داهێنانی چەند ڕێگەیەك بۆ هێشتنەوەی تەنگە نەفەسی یەکە لە ژێر چاودێریدا.

## جگەرە کێشانی خراپ

دوچاربوە بەدوکەڵی کەسانی دیکە هۆکاری یاریدەدەرن لە تەنگە نەفەسی لای منالان و جگەرە کێشان لەکاتی سك پریدا منال ئامادە دەکات بۆ دوچار بوون بە تەنگە نەفەسی

## حاڵەتی پزشکی یەکان

گەر تۆ بەدەست تەنگەنەفسی یەوە بناڵێنی ئەوا هەست دەکەیت کە ژمارەیەك لە هۆکارەکان لە نۆرەی تەنگە نەفەسی یەوە دەردەچن.

حالەتی پزیشکی یەکەم:

## تەنگە نەفەسی لای منداڵ

جۆن تەمەنی ٧ ساڵانە و دایکی تێبینی ئەوە
کوڕەکەی بەدەست تایەکی زۆرەوە دەناڵێنێ، ئەو لە کاتی
و یاریکردندا لەباخچەکەیاندا دەکۆکێ، دایکی جۆن
ئەو پزیشکە گشتی یەی کە هەندێ دژە تەنی بۆ دیاری
هیچ ئاکامێکی بەدەستەوە نەدا لە سێ بۆنەی
دیاردەکان درێژەیان کێشاو هیچیش دەرنەکەو
نەفەسیش کاتێ وەدەردەکەوێ کە ناڵە ناڵ و ویزە وی
کاتی ماندو بونی ژەمێکی وەرزشیدا لە قوتابخا
دەمەوانەیەکی گەورەی بۆ جۆن نوسیو ە کە لەکاتی
نیشانەکاندا بەکاری دەهێنا، وە لەو کاتی دەرکەوتنی ن
بەکاری دەهێنا، وە لەو کاتەوە ئەو لە دۆخێکی تە
باشدایەو توانای یاری کردنی هەیە بێ ئەوەی دوچار
نەفەسی بێت.

حاڵەتی پزیشکی دووەم

## بۆ نەخۆشی کە لە جوانی یەوە سەرچاوەدەگرێ

کارۆتین ئافرەتێکی تەمەن ٢٧ ساڵانە، بە دەست تەنگە نە
یەکی درێژ خایەنەوە دەناڵێنێ و پێش دومانگ لەمەو بەر ب
گەورە بوونی دیاردەکانی ئەو نەخۆشی یەوە ڕەوانەی
پزیشکی سنگ کرا، ئەو ژمارەیەکی زۆر لەو هاندەرە
نەخۆشانەی بۆ ئەو حاڵەتەی تەنگە نەفەسی یەی دیاری کرد کە

دەسـتیەوەدەینالاند لەوانـە دەنکۆڵـەی دەرپـەڕیوی گـژوگیا و درەختەکان و ژمارەیەك لەو گیاندارانەی کە جوانن وەك بەشێکیش لە هەڵسەنگاندنی حاڵەتەکەی، پزیشکەکەی لەحاڵەتێکدا سەردانی کردو ١٤ پشیلە پێشوازیان لێ کرد، ئەمەش ئەوەیا نیشان دەدات کە کارۆلین پەروەردەیان دەکات و ڕوبەڕویان دەبێتەوە و ئەمەش کارێکە پزیشکە گشتی یەکەی پێ ی نەزانیوە

کـارۆلین کـارلێکێکی پێـستی بـەهێزی نیـشاندا دژی جـوانی ئـەو پشیلانە لەکاتی ئەنجامدانی تاقیکردنەوە شیاوەکەیدا بەڵام نکوڵی لەوە کرد کە خۆ ئالانی پشیلە کان و یاری لەگەڵ کردنیان باری تەندروستی بەرەو خراپ بەرن ڕوون و ئاشکرایە کە پشیلە کان هۆی سەرەکین بۆ ئەو حاڵەتی تەنگە نەفەسی یەی کە کارۆلین بەدەستەوە دەناڵێنێ، وە ئەم گیاندارانە وای لێ دەکەن کە هەمیشە بە شێوەیەکی بەردەوام ڕوبەڕوی بۆ نخۆشی بێتەوە و ئەمەش هۆی دوچار بونیەتی بە تەنگە نەفەسی یەکی گەڕاوەو درێژ خایەن و بەردەوام، ئەو قایل نەبوو پشیلەکانی لێ دوربخەنەوە چونکە ئەوان نزیکترین هاوڕێی ئەو بوون بۆیە پێویستە بگەینە هاوسەنگی یەك لە نێوان ئەو تەنگە نەفەسی یە کە بەهۆی بۆ نەخۆشەکان و ئەو سودانەش کە لێوەی دەست دەکەون لە مانەوەی کارۆلین لەگەڵ هاوڕێ و دۆستەکانیدا.




## هاوڕێیانی خاوەن جوانی



دەرکەوت کە پشیلەکانی کارۆلین هۆی سەرەکی ئەو تەنگە نەفەسی یەن کە ئەو دوچاری دەبێت ئەو بەدەست بۆنخۆشی بۆ جوانیان و ژاوەژاو dender دەناڵێنیّ کە هەمیشە پێشنیاری دەکات.

حاڵەتی پزیشکی سێیەم

## بۆنەخۆشی کە لە بۆنەوە سەرچاوەدەگریّ



حۆرجینا ماوەی ٢٢ ساڵ لە بەشی ئامادەکاری جوانکاری لە گەنجینەی گەورەکانی ناوچەکەیدا کاریکرد، پاشان لە پایزی یەکێك لەو ساڵانەدا دوچاری تەنینەوەی ڤایرۆسی هات، ئەو تەنگە نەفەسی یەی لێ دەررکەوت کە هەر لە سەرەتاوە بە ئاسانی و چەند دەزگایەکی گەورە لە جۆرجینا دەرکەوتن بە تایبەتی بە شانەوە دەرکەوت کە تاکە هاندەری سەرەکی بۆنەکانە ئەو لە بەکار هێنانی بۆن وەستاو بەڵام پاش باشبونێکی کەم لەسەرەتاوە و دیاردەکانی پەیوەست بوون بە شێوەی ڕونی بەڕوبەڕوبونەوەی بۆنەکان لەفرۆشگاکەدا، لە کۆتایدا ناچار بوو لە پشەکەی دور بکەوێتەوە (کە تەمەنی ٥٨ ساڵ بوو) دواتر بە شێوەیەکی زۆر لەبەر چاو تەندوستی ڕوی لەباشی کرد .

- هەستی جۆرجینا بۆ بۆنەکان پاش چەند ساڵێك لە پەیوەندی کردن بە کارەکەیەوە لە بەشی ئامادە کردنی جوانکاری دەستی پێ کرد، بەڵام پاش ئەوەی هەستی بەمە کرد توانای بەرگە گرتنی بۆنی نەماوە بە ناچاری وازی لە کارەکەی هێنا.

حاڵەتی پزیشکی چوارەم

## پیس بوونی زەپۆش

دیڤید لاوێکی تەمەن ٢٠ ساڵانە و بەدەست تەنگە نەفەسیەکی سامناکەوە دەناڵێنێ هەندێ دژواری لە زاڵبون بەسەر ئەو تەنگە نەفەسی یەدا لە پایزێکدا بەدی کرد، دەرمانەکانی هەڵ مژینی زۆرتر بوون و پزیشکە گشتی یەکەشی دوکۆمەڵە لە ژەمەکانی حەبی شێ و بیری بۆ نوسی، لەگەڵ نزیك بونەوەی وادەی کۆتایی ساڵ، لانی کەم تەندروستی ڕوی لە هێور بونەوەیەکی کەم کرد کاتێ کە شاری برمنگهام دوچاری پیس بوونی هەوای زەپۆش بویەوە کە ماوەی ٥ ڕۆژی خایاند و گەیشتە ئاست لوتکەکان لەسەری ساڵدا و لەگەڵ هاتنی ئەو ڕۆژەدا حاڵەتی تەنگە نەفەسی لای دیڤید زۆر خراپ بوو ئەگەر ئەو زیاتر سەرگەرمی خواردنی حەبی سێتی سبیر و زیاتر بەکارهێنانی دەرمانی هەڵمژین بوو بەڵام دوچاربوو کە بۆ ماوەیەك لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە.




## هۆکارە سەرەکی یەکانی هاندەر بۆ تەنگە نەفەسی



### ڕاهێنانی وەرزشی

لای کەسێکی دوچار بە تەنگە نەفەسی، ڕەنگە هەریەکە لەم هاندەرانە ببێتە مایەی نویێ بونەوەی تەنگە نەفەسی وە بە خێرایی مرۆڤ ئەو هۆکارانە جیا دەکاتەوە کاری تێدەکەن

ڕاهێنانی وەرزشی هاندەرێکی زۆر ڕوونە لای منداڵ، ڕەنگە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا تاکە هۆکار ببێت بۆ دەرکەوتنی دیاردەکانی تەنگە نەفەسی، گرفتیش ئەوەیە کە دژواری هەناسەدان (تەنگە نەفەسی) لە کاتی ماندوبوندا لە زۆربەی کاتەکاندا دەبێتە مایەی لەدەست دانی تواناکان لە بری تەنگە نەفەسی.

هەر لەم کاتەدا قوتابی قوتابخانە هەست دەکات توانای تەواوی نی یە تالە هیلی هێرش بەری تۆپی پێدا یاری بکات (ئەمەش وامان لێ دەکات کە لە مەترسی دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی زۆر گەورە دابین لە گۆڵچی یە دوچار بوەکانی تەنگە نەفەسی!)



## بۆنەکان

دەرکەوتنی (دەنکۆڵەکانی کوتان) ئەو هاندەرەیە کە بە شێوەیەکی زۆر باش دەکرێ جیا بکرێتەوە بەڵام ئاژەڵەکان بە تایبەتی پشیلەو ئەسپ و هاو شێوەکانی هۆکاری سەرەکی تەنگە نەفەسین وە دوچاری بونی ماوە درێژ دەبێتە هۆی دیاردە زۆر بەردەوامەکان، وە ئێمەش گرنگی ئەم ئاژەڵانە لەماوە خافڵگیر دەکەین، وە کاتێ کە نەخۆش بانگەشەی ئەوە دەکات کە توانای ئەوەی هەیە بە سۆز بێت لەگەڵ پشیلەو بەبێ دوچار بون بەو نەخۆشی یە هەست بەوە ناکات کە دوچار بونی ماوە درێژ دەبێتە هۆی نیشانە درێژ خایەنەکان.

## دوکەڵ و تەپ و تۆزو بۆنەکان

دوکەڵی جگەرە هۆکارێکی بەهێزە بۆ زۆرێك لە نەخۆشەکان، هەروەها ئەم حاڵەتە بەهەمان شێوەیە بۆ ئەو شوێنانەی کە تەپ و تۆزیان زۆرە، کە وەك هاندەرێك وایە، وە ڕەنگە بۆنەکانی وەك عەترو قۆلۆنیای پاش سەرتاشین هاندە بن بۆ ئەو کەسە دیارانە بەڵام ئەم حاڵەتە زۆر دیار نی یە.

وە ئەوەی کە پێویستە فەرز بکرێت ئەوەیە کە ئەم حاڵەتە بریتی یە لەکار لێکی هاندەر لەگەڵ مادە کیمیاوی یەکان و باشترین




چارەسەرە بۆی لە دور خستنەوەی ئەم بۆنانە ئەگەر بکرێت، لەگەڵ ئەوەی کە ئاکامەکانی مەترسیدار دەبێت.

## هۆکارە سەرەکی هاندەرەکانی تەنگە نەفەسی

### پەتاو ڤایرۆسەکان



حاڵەتـەکانی تەنینـەوەی ڤایرۆسـی لـە زۆر تـرین هۆکارەکـانی دیـاری تەنگـــە نەفەســـین لـــە هـــەموو تەمەنەکانــدا وە دژە تەنــە زینــدوە کاریگەرەکان لە تەنها لە چارەسەری تەنینـــەوەی میکرۆبـــی کـــە زۆر دەگمـەنن لـە حاڵەتـەکانی تەنگـە نەفەسیدا، هـەروەها ڤایرۆسـەکان کاریگەریان بۆ سەر ئەو دژ تەنانە نابێت کە تاڕادەیەك جێگەیان نی یە لە چارە سـەری تەنگـە نەفەسیدا بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەکار دێ بـۆ تەنگـە نەفەسی زۆر گەورە.



### هەڵچون و ماتەمینی

زۆرێـك لـە منـداڵان لـە ئاهەنگـەکانی جـەژنی لـەدایك بونیانـدا دوچاری نـاڵین دێـن و ئەمـــەش کۆبونەوەکـە دەخاتـە خرۆشـان و مانـدو بـوون و تەنگـە نەفەسـی زۆر ڕون و ئاشـکرا وە ساڵانێکی دورو درێـژ تەنگـە نەفەسـی وەك حاڵـەتێکی دەمارگیری

دانی پێدا دەنرا بەڵام ئەمڕۆ زۆر بە ئاشکرا دیارە کە هۆکاری هەڵچون تەنها هاندەرن بۆ تەنگە نەفەسی نەك لە هۆکارەکانی نن خرۆشان و دڵتەنگی و ماتەمینی ئەمانە هەموویان دەکرێ هاندەری نوێ بونەوەی تەنگە نەفەسی بن، نەخۆشەکان بە زرۆی لەکاتی ئامادەبونیان لە پرسەو بۆنە ماتەمینی یەکاندا دوچاری تەنگە نەفەسی دەبن.



## کەش و پیس بوونی ژینگە

زۆرێك لەدوچار بوانی تەنگە نەفەسی ئەوەدەزانن کە کەش کاریگەری دەبێت لەسەریان بەڵام هیچ شێوازێکی یەگرتو نی‌یە بۆ هەموو حاڵەتەکان هەندێکیان کەشی سارد لە کەشی گەرم بەباشتر دەزانن و هەندیکی دیکە ئاو هەواری گەرم و وشك بە باشتر دەزانن، وە نەخۆش باشتر دەزانێ کە چی شیاوە بۆی و هەمیشە ڕەفتاری چارەسەرەکانی خۆی ڕێك دەخات.

وە چەسپاوە کە ماوەکانی بەرز بونەوەی پیس بونی ژینگە دەبێتە هۆی نوێ کردنەوەی تەنگە نەفەسی و بەتایبەتی لای ئەو نەخۆشانەی کە بە شێوەیەکی سامناك بەدەست تەنگە نەفەسی یەوە دەناڵێنن، وە ئەمەش لەمادەکانی بوونی ئۆزن لە هاویندا و لە کاتی بەرز بونەوەی پیس بوونی ژینگە لە زستان بەڵام هیچ بەڵگەیەك نی یە لەسەر ئەوەی کە ڕوو بەڕو بونەوەی پیس بوونی




ژینگە لە ئاستەکانی ئێستایدا کەسێکی نادوچار بوو بە تەنگە نەفەسی بگوێزرێتەوە بۆ نەخۆشێکی تەنگە نەفەسی.

حاڵەتی پزیشکی پێنجەم:

## حەساسیەت بۆ دەرچوون



لە هاوینی یەکێك لە ساڵەکاندا گەردەلولێکی سامناك و کوشندە، دای لە باشوری بەریتانیا کە لە ناوچەی ساوتهابتۆنەوە بەردی شاری لەندەن دەرچوو بوو وە تێپەڕیبو بە ئاڕاستەی باکور بەرەو ڕۆژهەلاتی ئەنگلیا. وە لەم ماوەیەدا سەدان نەخۆش پەنایان برد بۆ بنکە تەندروستی یەکان کە بەدەست تەنگە نەفەسی یەوە دەیان نالاند ئەگەر چی ژمارەیەکیان نەیان دەزانی کە دوچاری تەنگە نەفەسی بوون بەلام زۆرێکیان دانیان بەوەدا دەنا کە لەگەڵ بوونی نالە ناڵدا تایەکی زۆریانهەیە کە پێوەی دەناڵێنن دواتر ئەوان دوچاری تەنگە نەفەسی بوون بەلام لە هۆکارەکانی کەش و هەواو بەرز بونەوەی ڕێژەی دەرچوون لە هەوا لە دوایی بلاو بونەوەی تەنگە نەفەسی یەوە بوە کە ئەمەش نمونەیەکی دراماتیکی یە بۆ ڕادەیەکی وا کە کار لە نەخۆشەکانیتەنگە نەفەسی بە کەش بکات.

## خاڵە سەرەکی یەکان




* دەکرێ لە خێزانێکدا چەند تاکێك دوچاری تەنگە نەفەسی بن بەڵام نەخۆشێك بەدەستی تەنگە نەفەسی یەکی سامناکەوە کە دەناڵێنێ دەکرێ بێتە دایکی چەند منداڵێك کە ئەو نەخۆشی یە یان نەبێت.

* گرنگترین هۆکار بۆ تەنگە نەفەسی بە تایبەتی لای منداڵ خورکی تەپ و تۆزی ماڵەوەیە.

* دیاردەکان لەگەڵ هۆکارێکی ڕوندا دەر دەکەون، یان لە دوچار بون بە هۆیەکی کاریگەر سەرچاوە دەگرن یان زیاتر وەك ڕاهێنان وەرزی یەکان و تەنینەوەی ڤایرۆس و دوکەڵ و تەپ و تۆز ودڵتەنگ و ماتەمینی و کەش و هەواو پیس بونی ژینگە.

* کۆمەڵەجیاوازەکان لە هۆکارە هاندەرکان کار لە مرۆڤە جیاوازەکان دەکەن

هۆکارە هاندەرە کاریگەرەکان

لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دو هۆکاری هاندەر زیاتر کاری خۆیان دەکەن و چەند کۆمەڵێکی جیاواز لە هۆکارەکانی ڕۆڵی گرنگی خۆیان لە هەندانی نۆرەکانی تەنگە نەفەسی دەبینن لای کەسانی جۆر بەجۆر ەنگە نەفەسیش حاڵەتێکی زۆر کەسێتی یە سود بە کەسێك ناگەیەنێ کە بە پێ پێویست سود بە کەسێکی دیکە بگەیەنێ.

وە پێویستە شێوازەکانی دورکەوتنەوەو چارەسەرو پلانی پێش وەخت ڕێك بخرێت بۆ هەمو تاکێك بەتەنها.

## نیشانەکان و دیاری کرنیان



زۆر جار دیلوی کردنی تەنگە نەفەسی کارێکی دژوارە لە بەر ئەوەی زۆر ئاسانە کە تێکەڵ بونێك لە نێوان دیاردەکانی تەنگە نەفەسی و گرفتەکانی دیکەی هەناسەداندا هەبێت.

وە پاش سەیر کردنی تۆماری نەخۆشەکە و ئەنجام دانی شیکاری و تاقیکاری دیاری کردنێکی دروست بۆ ئەو کەسە بکرێت.

## تاقیکاری دڵنیایی

پشکنینی جەستەیی دڵنیایی یە بۆ نەخۆش بەلام بەگرنگی تاقیکاری یەکانی کاری دوسیەکە نی یەنیشانەکان کامانەن؟

کەسی دوچار بوو بە تەنگە نەفەسی یەکێك یان زیاتر لەم چوار دیاردە دەرەکی یەی بۆ تاقیکاری دەکرێت:-

ناڵە ناڵ و تەنگە نەفەسی (یان دژواری هەناسەدان) و کۆکە و گەمارۆدرانی سنگ (یان تەنگ بونەوەی سنگ)

## تەنگە نەفەسی

ناڵە ناڵ و تەنگە نەفەسی دو دیاردەن کە بە ئاسانی دەست نیشان دەکرێن و هەمیشە بە شێوەی پچڕ پچڕ ڕوو دەدەن یان وەڵامدانەوەن بۆ هاندەرێکی ناسراو یان بە شێوەیەکی ناچاوەڕوان کراو، بەڵام بە زۆری تەنگە نەفەسی بەبێ ناڵە ناڵ ڕوو دەدات. کۆکەکەش زۆر جار وەك نیشانەیەك بۆ تەنگە نەفەسی جیا ناکرێتەوە ئەو کاتەش کۆکەکەیان ووشك دەبێت یان هەندێ جار بەڵغەمی لەگەڵدا دەبێت وە بە شێوەیەکی نمونەیی لە شەودا یان لەکاتی ڕاهێنانە وەرزشی یەکاندا ڕوو دەدات.

وە زۆر جار هەست نەکردن بەوەی کە ڕەنگە کۆکە لە تەنگە نەفەسی یەوە سەرچاوە بگرێت بۆ دەست نیشان کردنی سوتانەوەی بۆرری یەکان و ئەمەش هەمیشە بەدژەتەکان چارەسەر دەکرێت، کە چارەسەرێکی ناشیاو بۆ تەنگە نەفەسی پێك دێنێ.

### چوار نیشانەی سەرەکی یەکانی تەنگە نەفەسی

دەکرێ کە ناڵەو دژواری هەناسەدان زۆر ترین نیشانە دیاردەکانی تەنگەنەفەسی بن، ئیتر چ پێکەوە بن یان بە جیاوە دژواری یەکی گەورە تر لە جیا کردنەوەی کۆکەی هەمیشەدا هەیە کە لەکاتی ماندو بوندا نەبێ تەنگی سنگ دەر ناخات

ناڵە ناڵدانەوەیەك بۆ هاندان یان هەر هۆکارێکی ڕونتر






## کۆکە



کۆکـەی بەڵغـەماوی یـان وشـك نیـشانەی هەبوونی تەنگە نەفەسین

## تەنگە نەفەسی



زۆر جـار لەگـەڵ ناڵـە ناڵـدا هـاوڕێ دەبـن وە کۆکەکەش دەکرێ کە بەتەنها ڕوو بدات

## گیرانی سنگ



زۆر جـار نیـشانەی تەنگـە نەفەسـی دەبێـت بەڵام دەکرێ وەك گرفتێك لـە دڵ بێتـە هـەژمار لەلای بەساڵا چوان روداني زیاتر لە دوکۆکەی هەمیشەیی لەگەڵ ناڵە ناڵ و تەنگە نەفەسیدا یـان لەگـەڵیان پێویـستە گرفتێـك بـۆ ڕژێنـی لەگـــەڵ حاڵــەتی تەنگــە نەفەســـی لـــەهزری نەخۆش و پزیشك پێکەوە.

نیـشانەی سـەرەکی چـوارەم بـۆ تەنگـە نەفەسـی گیرانـی (تـەنگی) سنگ و ئەمەش بـە زۆری لـەکاتی مانـدو بونـدا ڕوو دەدات وە کاتـێ کــە لای نەخۆشــە بەساڵاچــوەکان ڕوو دەدات ئــەوا دڵ ئێــشەیەك

دەست نیشان دەکرێ کە زۆر دژوارە لەسەر پزیشك ئەم گرفتە جیا بکاتەوە.

زۆر جار نیشانەکانی تەنگە نەفەسی لەگەڵ هۆکارێك ڕوون دەردەکەونن بەڵام ئەوەی کە جیایان دەکاتەوە ئەوەیە کە ڕەنگە نەخۆش لە خەو بێدار بکاتەوە زۆر جار لەکاتی بێداری بەیانیاندا گرفتێ بسازێنێ.

لەخەو هەستان بە هۆی نیشانەکانی تەنگە نەفەسی یەوە مانای وایە کە ئەم تەنگە نەفەسی یە بە شێوەیەکی دروست چارەسەری بۆ نەکراوە، وە ڕاهێنانی وەرزشی یەکان بە تایبەتی لای منداڵ هاندەرێکە بۆ نیشانە گەورەکان کە زۆر جار دەبێتە هۆی ڕێگری منداڵ لە بەشداری کردنی لە یاری ویاری یە وەرزشی یەکان لە قوتابخانەدا.

## ڕاهێنانە وەرزشی یەکان و تەنگە نەفەسی



زۆر جار منداڵە دوچار بوەکان بە تەنگەنەفەسی پێیان وایە کە ڕاهێنانە وەرزشی یەکان دەبێتە مایەی نوی بونەوەی، بەڵام ئەگەر تەنگە نەفەسی یەکە بە شێوەیەکی گونجاو لە ژێر کۆنترۆڵدا بوو، ئەوا پێویست ناکات بەربەستێ بۆ وەرزشی و چالاکی یەکانی دیکە دیاری بکرێت.

## تەنگە نەفەسی چۆن دەست نیشان دەكرێت

گرفت لەم نیشانانەدا بریتی یە لەوەی كە لە زۆر جۆرری دیكەی نەخۆشی یەكانیی سی و دڵدا دەردەكەون لەبەر ئەوە تۆمارێكی گرنگن بۆ بونی ئەو نیشانانەو دەرچونی و ماوەكەی و ماوەی رادەكەی و ئەگەری هەر شێوازێكی جیای هەبێت ئەوا هەمویان پێویست دەبن بۆ هاریكاری كردنی پزیشك لەگەیشتنە دیاری كرانی ڕاست و ردوست

گوێگرتن لە سنگ بەشێكە لە هەر پشكنینێكی پزیشكی بەلاّم لە حاڵەتی تەنگە نەفەسیدا زۆر جار هاوكاری پزیشك ناكات، وە نەمانی ناڵە ناڵیش مانای ئەوە نی یە كە تەنگە نەفەسی یەك دروست دیاری نەكراوە هەر وەك ئەوەی كە هەموو ناڵە ناڵێك سەرچاوە لە تەنگە نەفەسی یەوە ناگرێ و ئەمەش، وا لە تەنگە نەفەسی دەكات كە كارێكی زۆر سەخت بێت.

## تەنگە نەفەسی

ئەو نەخۆشیانەی کە هەمان نیشانەی تەنگە نەفەسی یان هەیە نیشانەکانی تەنگە نەفەسی لە هەندێ پەشێوی هەناسەدانی دیکەو هەندێ نەخۆشی دڵدا دەردەکەون، وە ئەم خشتەی خوارەوە هەندێ نەخۆشی دیکەیە کە هەمان نیشانەکانی تەنگەنەفەسی و بڵاوبونەوەیان تێدا دەردەکەوێ.

| دەست نیشان کردن | ناڵە ناڵ | گیران نەفەس | کۆکە | گیرانی سنگ |
|---|---|---|---|---|
| تەنگە نەفەسی | ••• | ••• | ••• | ••• |
| سوتانی درێژخایەنی بۆری یەکان | ••• | ••• | ••• | ·· |
| بادار | ·· | ••• | O | ••• |
| فراوان بوونی بۆری یەکان | ·· | ·· | •••• | ·· |
| ئازاری دڵ | O | ·· | O | •••• |
| سەرنەکەوتنی دڵ | ·· | •••• | ·· | ·· |

## هێماکان

O هەمیشە دەرناکەوێ

·· ڕەنگە دەرکەوێ

••• زۆر دەردەکەوێ

•••• تاڕادەیەك هەمیشە دەردەکەوێ




## زۆر تاقیكاری یەكانی هەناسەدان

بە پشت بەستن بە تۆماری پزیشكی نەخۆشی دەكرێ كە كاری دەست نیشان كردنی تەنگە نەفەسی ئەنجام بدرێت، بەلاّم زۆر جار هەندێ تاقیكاری سادەی دیكە بۆ هاوكاری كردن لە دەست نیشان كردنەدا ئەنجام دەدرێ وەلای ئەو نەخۆشە بەسالاّچوانەی كە گرفتی دلّیان زۆرە باش وایە كە هێلّكاری كارەبایی دلّیان بۆ بكرێت، بەلاّم تاقیكاری یەكانی هەناسەدان كۆلّەكەیەكی بەرین لە حالّەتی تەنگە نەفەسیدا پێك دێنێ.

دوجۆری سەرەكی لە تاقیكاری هەناسەدان بەكارهاتوو لە دەست نیشان كردنی تەنگە نەفەسیدا هەن- تاقیكاری یەكانی فییچقە كردنی لوتكەو پێوەری هەناسە وە هەردو جۆرەكە ماوەی تەنگ بونەوەی ڕیڕەوە هەوایی یەكان دەپێون ڕەنگە لەبەر ئەوە ئەوە بێت كە هەر كاتێ ڕێڕەوەكان تەسك بونەوە ئەوا ڕەوتی هەوا تیایاندا هێواش بێتەوەو دابەزێت بۆ پلەیەكی تۆمار كراوپێوەری فیچقە كردنی لوتكەپێوەری فیچقە كردنی لوتكە دەزگایەكی بچوكی بتەوی هەزارە بیرۆكەیەك سەبارەت بە تەنگ بونەوەی ڕێڕەوە هەوایی یەكان بە پێوەرێكی زۆر خێرا بەدەستەوە دەداتن یان بەو خێرایی یە لوتكەیەی كە هەواكەی پێ دەردەكرێت، وە ئەم ڕێگەیە لەلایەن پزیشكە گشتی یەكانەوە زۆر بەكار دەهێنرێ و تاكە ژمارەی تۆمارر كراویش لە عیادەكاندا پێك دێنێ، بەلاّم ئێوە دەتوانن ئەو دەزگایەی خۆتان بەكاری بهێنن بۆ فیچقە كردنی لوتكە لای خۆتان كە لە ڕۆژێكدا ٢ تا ٣ تا ٤ جار ئەم كارە دوبارە دەكەنەوە بۆ دەرخستنی جیاوازی پلە لە ماوەی یەك ڕۆژدا.

## تەنگە نەفەسی

لای مرۆڤـی ئاسـایی جیـاوازی فیـچقەی لوتکـە زۆر بـچوکدەبێت لەماوەی ڕۆژەکان وتەنانەت هەفتەکانیشدا، وە لە کاتێکدا ئەگەر ئەو کەسـە بەدەسـت تەنگـە نەفەسـی یـەوە بناڵێنـێ ئـەوا یـان جیـاوازی یـەکی بـچڕ بچڕ یـان چەسـپاو دەردەکـەون وە لـە شـێوازە جیـاوازە دیارەکان دابەزینی بەیانیانە، ئەگەر ژمارەکان لـە نـزمترین ئاسـیاندا بـوون لـە خەوزڕانـدا، وە هەنـدێ جـار دابـەزین لـە فیـچقەی لوتکـەدا پـچڕ پـچڕ دەبێتـت و زۆر جـار وەلامێـك دەبێـت بـۆ هانـدەرێکی زانراوی وەك جوانی پشیلە.



### پێوەری فیچقەی لوتکە

پێـــوەری فیـــچقەی لوتکـــە دەزگایـــەکی ســـادەیە پـــاش وەرگرتنی هەناسەیەکی قووڵ ئەو کەسەی کە بەکاری دێنـێ فویـــەك دەکـــات بـــە کـــونی دەزگـەدا و هـەوا لـە دەرەوە هەڵخلیـسکاوە کـە دەجوڵێنـێ و خـاڵی پێوەری پلـەدارە کـە دەردەکـەوێ و ئـەو کاتـە هەڵخلیسکاوە کـە بـە خێرایی دەوەسـتێ بۆ فیـچقە کردنـی هـەوای دەرەوە لـە هـەردو سـی یەکاندا.

## چۆن پێوەری فیچقە کردنی لوتکە بەکار دەهێنرێ



پزیشکەکەت یان پەرستیارەکەت کە پسپۆڕی تەنگە نەفەسی یە ئەوەت بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چۆن پێوەری فیچقە کردنی لوتکە بەکار دەهێنرێ بە شێوەرەیکی دروست، وە ئەم زانیاری یانەی خوارەوەش بیرهێناوەیەکە بۆ ڕێگەی بەکار هێنانی

١- ئەگەر کرا لە شوێنی خۆت بوەستە.

٢- دڵنیا بە کە هەڵخلیسکاوەکە لەسەر پلەی سفرە.

٣- هەناسەیەکی قوڵ وەربگرەو پێوەری فیچقە کردنی لوتکەکە بخەرە دەمتەوەو (بەشێوەیەکی ئاسۆیی بیگرەوە) لێوەکانت بچەسپێنە.

٤- لە پڕو بەهێز فوی پیاکە

٥- ئەو ژمارەیە تۆمار بکە کە پێوەرەکە دیاری دەکات.

٦- پێوەرەکە بگەڕێنەوە بۆ سەر پلەی سفر.

٧- دوجاری دیکە ئەم کارە دوبارە بکەرەوە بۆ دەست کەوتنی سێ خوێندنەوە

٨- باشترین خوێندنەوە یان تۆمار بکە








## وێنەی بیانی فیچقەی لوتکە

زۆر جار دوچار بوان گۆڕانکاری لە خوێندنەوەکاندا بەدی دەکەن وە ئەم دو شێوازە جیاوازە گۆڕانێکی بچڕ بچڕ (لەسەرەوە) و گۆڕانی دابەزینی بەیانیانی کلاسیکی (لە خوارەوە) دەردەخەن.

پێوەری فیچقە کردنی لوتکە بەم شێوەیە زۆر سودمەند دەبێت گەر ئێوە جگە لە نیشانە پچڕو پچڕەکان لە هیچی دیکە سکالاٚ نەکەن وە دەکرێ چاودێری کردنی فیچقەی لاوتکە ڕۆژانە بە سود بێت بۆ دورترین سنور لە دانانی پلانی چارەسەر ئەگەر وەك ئامێرێکی وریاکەرەوە سەرەتایی کار بکات بۆ پێشبینی کردنی هەر گەورە بونێ لە حاڵەتی تەنگە نەفەسیدا.




## پێوەری هەناسە

ئەم ڕێگەیە بە شێوەیەکی تایبەت لە عیادەکاندا بە تایبەتی بەکار دەهێنرێ بۆ نەخۆشی یەکانی سنگ و لە نەخۆشخانەکانیشدا بەهەمان شێوەیە بەلام ژمارەیەکی زۆر لە عیادەکانی پزیشکی گشتی ئەمڕۆ پێوەری هەناسە (spiro metry) بەکار دێنن وە لەم تاقیکاری یەدا تەنها خێرایی فوی هەوا ناپێورێ بەلکو ئەو ڕێژەیەش دەپێورێ کە هەموجارێ بۆ دەرەوە فوی پێدا کراوە، وە پێوەری هەناسە زانیاری زیاترمان دەداتێ، بەلام ناتوانێ پێوەرەکانی ڕۆژانەمان بۆ خوێندنەوەی ڕەوتەکانی لوتکە پێ ببەخشێ.

## تاقیکاری یە هەلگەڕاوەکان

زۆر جار تاقیکاری یەکانی هەناسەدان پێش و پاش هەلمژینی دەرمانێکی زۆر بۆ بۆری یەکان ئەنجام دەدرێ، ڕێڕەوەکانی هەوا دەکرێنەوەو ئەگەر خوێندنەوەکان ڕێژەیان ١٥٪ بەرزبونەوە یان پتر بوون پاش هەلمژینی دەرمانەکە ئەوا تەسک بونەوەی ڕێڕەوە هەوایی یەکان پێچەوانە دەبێتەوەو جەخت لەدەست نیشان کردنی تەنگە نەفەسی دەکات وە نەخۆشەکانی تەنگە نەفەسی هەمیشە و لە هەموو تاقیکاری یەکدا پێچەوانە دەرناکەون بەلکو لەگەل ئەمەدا تاقیکاری یەکە بە دیاری کراوی دەمێنێتەوەو زۆر سودمەند دەبێت بۆ ئەو نەخۆشانەی گومانی دوچار بونیان بەتەنگە نەفەسی هەیە.




## تاقیکاری یەکانی دیکەی هەناسەدان

گەر دەست نیشان کردنی حاڵەتەکەت دژوار بێت ئەوا ڕێڕەوی تاقیکاری یانە زۆر ئاڵۆز دەبن و هەمیشە لەسەر دا خوازی پزیشکی نەخۆشخانەکان دەبن.

خاڵە سەرەکی یەکان

- نیشانە سەرەکی یەکانی تەنگە نەفەسی چوارن! ناڵە ناڵ گیرانی هەناسە، کۆکە گیرانی سنگ
- بێدار بونەوەی شەو لەگەڵ نۆرەی تەنگە نەفەسی مانای وایە کە تەنگە نەفەسی یەکە بە شێوەیەکی شیاو تەواو چارەسەر نەکراوە
- پێویستە ئاماژە بە زیاتر لە دوجار لە کۆکەی بەردەوام بکرێت بۆ ئەگەری دوچار بوون بە تەنگە نەفەسی
- ناڵە ناڵ بە پێ پێویست ئاماژە بە بونی تەنگە نەفەسی ناکات و تەنگە نەفەسیش ناڵە ناڵ بە پێویست ناگرێتەوە.
- زۆر جار تاقیکاری یەکانی هەناسەدان بۆ هاریکاری لە دڵنیایی دیاری کردن بەکار دێت.




## خۆ پاراستن و هاوکاری خود

ڕەنگە دەست نیشان کردنی تەنگە نەفەسی بە شێوەیەکی ناچاری پێشڕەوی بکات بۆ بەکار هێنانی دەرمان بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەو حاڵەتە جگە لەوەی کە چەند ڕێگەیەك هەیە کە تۆو خێزانەکەت دەتوانن بە هۆیەوە هاریکاریمان بکەن بۆ سوك کردنی نیشانەکان هەرروەها هەندێ گۆڕانکاری ژینگەیی هەیە کە پێ ناچێت کە هاوکاری دوچاربوان تەنگە نەفەسی بکات



### یاری یە نەرم و شلەکان

ئاسایشە دانانی یاری یە نەرم و شلەکان لە یەخچاڵ بۆ ماوەی ١٢ کات ژمێر لە هەفتەیەکدا خورکی تەپ و تۆزی ماڵان دەکوژێت

قوربانیدان بۆ نەخۆشەکان

زاڵ بوون بەسەر خورکی تەپ و تۆزەکانی ماڵەوە کارێکی زۆر گرنگە بۆ هەندێ نەخۆش بەڵام چارەسازی یە پێویستەکان بۆ ئەمە زۆر بە نرخە، بەکار هێنانی ڕاخەرو چەرچەف و بەتانی یەکان کشتەکە کاریگەرن بەڵام تەکلیف کراون تەنانەت ئەگەر پارچە قوماشێك لە بۆلیتنیی سادە بەکار بهێنرێ بۆ پێچانەوەی جێگەو تەواوی بالڤیەکان بە شێوەی

تەواو، بەڵام ئەمە دادەکات کە جێگەکان چرچ بن و ئارەق بکەنەوە، بەڵام ڕشێنە بەکار هاتوەکان بۆ کوشتنی خورکەکان بە تەنها کاریگەر نی یە لە کۆنترۆڵ کردن بەسەر تەنگە نەفەسیدا وە لە لایەنی تیوری یەوە پێویستە ڕاخەرو کەل و پەلە ناچەسپاوەکان لابەرێن و لە بری ئەوە ئەگەر هەبوو هەندێ پەردەی کانزایی لە بری پەردە تایبەتەکان بەکار بهێنرێن وە هەروەها پێویستە یاری بە نەرم و شلەکان هەر هەفتەی ١٢ کات ژمێر بخەینە یەخچاڵەوە بۆ کوشتنی خورکەکان. وە بەسەرنجدان بۆ بونی ئەم چارە سازی یانە پێویستی بەکاتێکی زۆر دەبێت یان تەکلیف بەرزە ئەوا هەڵمژینی دەرمان ڕێگەیەکی زۆر ئاسان بۆ کۆنترۆڵ کردن لەسەر نیشانەکانەکانی تەنگە نەفەسی لای زۆرینەی خەڵکی دەسازێنێ خۆ ڕزگار کردن لە ئاژەڵە ماڵی یەکان شوێنی ناکۆکی یە و بە جۆرێ کە بوونی بۆنی خۆش گومانی تێدا نی یە لە بەرامبەر پشیلە یان سەگ یان کەروێشکەکان پێویستە بگاتە هاوسەنگی یەك لە نێوان کۆنترۆڵ کردنی تەنگە نەفەسی بەکار هێنانی هەڵمژینەکان و ئەو دڵتەنگی یەی کە دەکرێ لە دورخستنەوەی ئاژەڵەوە سەرچاوە بگرێ. جگە لە مەش ڕێکەوتنی درێژ خایەن لەگەڵ گیاندارە ماڵی یەکانیشدا هەروایە هەتا نەبێتە مایەی نۆبەیەکی ڕون و ئاشکرا وە دەکرێ کە تەنگە نەفەسی لەسەر ئاراستەی بۆماوەیی درێژ بەربەروبونەوەی نەخۆشی هەستەوەر بۆ ئاستە بەرزەکانی بۆنی خۆش بێت وەلای ئەونەخۆشەی کە بەدەست تەنگە نەفەسی یەکی سامناکیشەوەدەناڵێنی بەجۆرێ زاڵ




بـون بەسـەر ئـەم حاڵەتـەدا  زۆر دژوارە بۆیـە پێویـستە زۆر جـار سوربین لەسەر دورخستنەوەی ئەو گیاندارانە .

پێم وایە کە ئارەزوی نەخۆشەکان کارێکی زۆر گرنگە وە هەندێ کـەس خـۆ دەربـاز کـردن لەگیانـداری مـاڵی باشـتر دەزانـن لـە بەکارهێنانی دەزگای هەڵمژین و کەچی هەندێکیدیکە کە دوچار بـەم تەنگەنەفەسـی ئـەوەیان پـێ باشـترە کـە لـە زۆربـەی کاتەکانـدا هـاوڕێ باشـەکانیان لـە دەسـت نـەدەن بـەڵام کاتـێ کـە بیروبـاوەڕو ئارەزوەکـانی نـەخۆش ڕوبـەڕوی مەترسـی دەبێتـەوە پێویـستە جەختت لەسەر دورخستنەوەی گیانداران بدەین.

## گەرم کردنی سەرەکی

هیچ بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ نی یە لەسـەر ئـەوەی کـە گـەرم کردنـی سـەرەکی بـە شـێوەیەکی دیـار بـاش یـان خـراپ بێـت بـۆ نەخۆشـی تەنگـە نەفەسـی وە هەنـدێ لـە نەخۆشـەکان پێیـان وایـە کـە گـەرم کردنی سەرەکی کار دەکات بە سوتانی گازو وشك کردنـەوەی هـەوا بەڕادەیـەکی زیـاتر لـە پێویـست بـەڵام دروسـت نـی یـە کـە ئـەمجۆرە گەرم کردنە گرفتێکی گەورە بسازێنێ، وە لە لایەکی دیکەوە  چەند هەۆۆیـەکی تیـۆۆری بـەهێز هەیـە کـە پێیـان وایـە گـەرم کردنـی سـەرەکی بـە هـەوای گـەرم یـان گـوێزراوە بـە بـۆری یـەکان گرفـت دەسـازێنێ بـە تایبـەتی لای ئـەو نەخۆشـانەی کـە بەدەسـت حەساسیەتی خورکی تـەپ وتـۆزی ماڵـەوە دەناڵێنن، وە بـۆ خراپـی چارەنوسیش، وەتێچونی ئاڵوگۆڕی وەك ئەم ڕێکخراوانە زۆر بەرزن بـە تایبـەتی کاتێك هـیچ متمانەیـەك نـی یـە بـۆ ئـەوەی کـە نـەخۆش

پاش داماڵینی ڕوو لە باشی دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا ئامۆژگاری نەخۆشەکان دەکەم بە قوربانی دانی پێکهاتەی ئەم ڕێکخراوانە گەر هەڵدەستن بە پێکهێنانی ڕێکخراوێك هەبێ.

## هاوکاری خۆت و منداڵەکەت

* جگەرە مەکێشە
* بە پێی توانا خۆت لە دوچار بون بە پەتا دور بخەرەوە.
* هەوڵ بدە ڕوبەڕوی بۆنە خۆشەکان نەبینەوە.
* پلانێك داڕێژە بۆ چارەسەری خود بە هاوکاری پزیشکەکەت
* مامۆستاکان لە حاڵەتی تەنگە نەفەسی منداڵەکەت ئاگادار بکەرەوە تا بتوانن لە کاتی پێویستدا دەزگای هەڵمژینی بۆیە پەیدا بکەن.
* گەر کرا خۆت لە هاندەرە ڕونەکاندوربخەرەوە.

پلەی گەرمای ژوری نوستن

سێرجۆن فلوير يەكێكە لە پزیشكە بەناوبانگەكانی سەدەی ١٧ و دوچارە بە نەخۆشی تەنگە نەفەسی، ئەو پێ ی وایە هەر کاتێ کە تەنگە نەفەسی نەخۆش لەشەودا بێدار بکاتەوە ئەوا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ گەرما شوێنەکەی، بۆ نمونە دەڵێن خەوتن لەگەڵ کردنەوەی دەلاقەی ژورەکان یان لانی کەم هێشتنەوەی هاتوچۆی هەوای پی گەرد لە شەودا کارێکی زۆر باشە بۆ ئەو کەسانەی کە نەخۆشی تەنگە نەفەسیان هەیە، وە لە ڕاستیدا هیچ وەڵامێکی دروست بۆ ئەم کارە نی یە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ئەم هەوا بێگەردە بە باش دەزانن و هەندێکیان پێیان وایە کە نرکەو ناڵە

یان زیاتر دەکات بە تایبەتی ئەگەر بێدار بونەوەی شەو یان بە هەوا بێ گەردە بە باش دەزانن و هەندێکیان پێیان وایە کە نرکەو ناڵە یان زیاتر دەکات بە تایبەتی ئەگەر بێدار بونەوەی شەویان بەهەر هۆکارێك لەسەر بێت، وە جارێکی دیکەش چۆنیەتی ساز کردنی ئەو ژینگەیەی کە بۆ ئێوە شیاوە دەگەڕێتەوە بۆ خۆتان.

## پەتاو هەڵامەتی گەیشتوو

حاڵەتەکانی تەنینەوەی هەناسە دان وەك پەتای ئاسایی و هەڵامەتی گەیشتو ڕەنگە بێتە هۆی گەورە بوونی نیشانکانی تەنگە نەفەسی.



## تەنینەوی ڤایرۆسی

ڤایۆسەکان هۆکارێکن دور ناخرێنەوە بۆ گەورە بونی تەنگە نەفەسی بەڵام باش تر وایە کە خۆت لەسەردان و پێشوازی کردنی ئەو کەسانە دور بخەیتەوە کەدوچاری پەتایەکی بەخوڕ بوون، جگە لەوەش ناکرێ ئەم کارە بەنیسبەت هەندێ لە دایکان و قوتابیانەوە بکرێتە قوربانی و هەروەها پێویستە لەسەر منداڵەکان بچن بۆ قوتابخانەو ناکرێ بە هۆی مەترسی یەکی پێگەیشتتویانەوە بە پەتا لە دەرەوە بهێڵرێنەوە.




## ئەو بۆنانەی کە لە خواردنەوە سەرچاوە دەگرن

ڕێژە یەکی زۆر کەم لە دوچاربوانی تەنگە نەفەسی، بە تایبەتی منالآن بێ گومان بەدەست حەساسیەتی هەندێ خواردنەوەدەنالێنن، وە لێرەدا پێویستە بگەینە هاوسەنگی یەك لە نێوان ئارەزوی نەخۆشەکان و زالبون بەسەر تەنگە نەفەسیدا.

بونی خواردنەکان زۆر دیار و بلاو نین بەلام بێ گومان زیاتر بلاو دەبنەوە لەوەی کە پزیشکەکان بۆی دەچن وە زۆر جار دیاری کردنی ئەوحالەتەدژوارەو پێویستی بە تاقیکاری پێویست و مادەوە درێژ هەیە وە دەکرێ کە تاقیکاری یەکانی پێست ونکەر بن و پێویست نەکات پشتی پێ ببەسترێ بۆ بیماری کردن یان دورخستنەوەی بۆنی خواردنەکان، وەلای کەمایەتی یەکی نالاواز دەکرێ بۆ ناسینی خواردن و خۆراگەکان گەورەیی تەنگە نەفەسیمان لای کەسێکی وا چنگ بکەوێ کە زۆر کاریگەر بێت پێ ی.

وە زۆر ئاسانە، بۆ نمونە، ناسینی مێژوی ڕوون لە نالە نالێ پاش چەند خولەکێك لە خواردنی پاقلە یان کاکرۆسی سودانی، وە باشترین چارە سەر بۆ ئەم حالەتە بریتی یە لە قوربانیدان و خۆپاراستن لە خواردن ئەم جۆرە پاقلەیە لە لایەکی دیکەوە ناسینی بۆنە خۆشەکان سەرچاوە لە شێوەکانی شیر یان گەنم کارێکی‌دژوارە چونکە کاریگەری یەکان درێژ خایەن ترو زیاتر نابڕندە تر دەبن تا ئەم ڕادەیە.




حاڵەتی یەکەم:

## بۆنێك کە لە پاقلەی سودانی یەوە سەرچاوە دەگرێ



نیك هەر لە منداڵی یەوە بەدەست تەنگە نەفەسی یەوە دەناڵێنی وە کاتێ کە زانی پاقلەی سودان ڕەنگە هۆیەك بێت لە نۆرە سامناکەکان، ئەو سەرکەوت لە قوربانیدان بەدەستە بەرکردنی ئەو نۆرانە بە خۆدرو خستنەوە لەو خواردنانەی کە لە پاقلەی سودانی پێك دێت، وە ئەمەش کارێکی زۆر دژوارە، لە ماوەی کاتی هەرزەکاریدا تەنگە نەفەسی یەکە لای نیك زۆر باش بوو بەلام بە شێوەیەکی گەورە بەردەوام بو لە خۆدور خستنەوە لە پاقلەی سودانی، وە کاتێ کە ڕێکەوت تیکەیەك یان پارویەك لە خواردنی سودانی خوارد دەست بە جێ هەستی بە ئازارێك کرد لە دەمیدا و پێش قوتدانی تیکەکە پاروەکەی فڕێ دا وە ئەمەش هەمیشە لەگەڵ ڕوودانی نوێ بونەوەدا دەگۆڕا ، وە ڕۆژێك لە ماڵی یەکێك لە هاوڕێکانی نانی دەخوارد لە پڕو پارەیەکی قوتداو هەست کرد کە لە پاقلەی سودانی پێکهاتوە لە ماوەی چەند خولەکێکدا زمانی ئاوساو لێوەکانی دەستیان کردە نۆرە کردنی تەنگە نەفەسی یەکی سامناك وە کاتێ کە گەیشتە نەخۆشخانە شین دا گەڕا بووە وە لە هۆش خۆی چوو بوو، ئەو زۆر بەشێوەیەکی خێرایی گەیەنرایە نەخۆشخانە بەلام هەر پێویستی بە کاتێکی کەم هەبو بۆ گەڕانەوەی تەندروستی یەکەی هاوڕێ کەی هەستی بە تاوان و

